تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com
کەشکۆڵی
کەلەپووری ئەدەبی کوردی
کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی
محەمەد عەلی قەرەداغی
بەرگی چوارەم
چاپی یەکەم
بەغدا
١٩٩٣

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (٢٩٠)

# کەشکۆلی کەلەپووری ئەدەبی کوردی

کۆکردنەوەو لێکۆلینەوەی
محەمەد عەلی قەرەداغی

بەرگی چوارەم

چاپی یەکەم

بەغدا ١٩٩٣

# وتـەیـەك

ئەگەر لە سەرەتای ئەم بەرگەوە بمەوێ چەند شتێك بدركێنم ، پێش هەموویان ئەوە دەڵێم : کە تا زیاتر بگەڕێین‌و هەوڵی فراوانتر بدەین باشتر بۆمان دەردەکەوێ کە چ زیانێك لە کەلەپووری ئەدەبی ئەم گەلە کەوتوەو ، چەند گەوهەرو ملوانکەی نایاب‌و گرانبـەهای ئـەدەبیمان بێ‌سەروشـوێن بــوە .

لەم بەرگەدا ناوی کۆمەڵێك شاعیرو شیعری جۆراوجۆرو فرەبابەتیان دەخوێنیتەوە کە تا ئێستە لە بواری بووژاندنەوەی ســامانـی کەلەپووری ئەدەبیدا ــ وەك پێویست ــ لایان لێ‌نەکراوەتەوەو ، نەوەی ئەمڕۆی کورد بە ناوو بەرهەمیان ئاشنا نیە . ئەمانەیش رەنگە وەك دلۆپێك لە دەریایـەك بن . بۆ سەلماندنی ئەم قسە تەنها یەك قسەی مـامۆستای مـەزنـی کــورد (رەنجووری) دێنمەوە بیری خوێنەری کورد ، کە کاتێك دەیەوێ کۆڕی ئەدیبانی کۆنمان پێ بناسێنێ ، ناوی (٥٥) [١] پەنجاو پێنج لە شــاعیری مەشهوورو ناوداری‌کوردمان بۆ تۆمار دەکات . بەڵام کە ئەمڕۆ بمانەوێ سەرو سۆراخی بەرهەم‌و دیوانی ئەو (٥٥) شاعیرە بکەین دیوانی چەندیانمان بە تەواویی‌و کۆکراوەیی ، یان بە ناتەواویی‌و نیوەچڵی‌و کۆنەکراوەیی دەست دەکـەوێت ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ماندوبوونی زۆری ناوێ‌و بە چاوپیاخشاندنێکی کەمی کتێبخانەی کوردی‌دا بۆمان دەردەکەوێ کە (هیچ)[٢] !

---

(١) بڕوانە : دیوانی رەنجووری مەلاعومەری زەنگنە ، ل : ٧٢ .

(٢) مەبەستم لە ( هیچ ) ئەوە نیە کە هەر بە یەکجاریی هیچیان بۆ نەکراوە، چونکە شاعیری وەك ( وەلی‌دێوانە )و ( صــەیــدی‌هــەورامی ) و ( بێسـارانی )هەن کە بە کرچ‌و کاڵیی‌و ناتەواوی شتێك بۆ دیوانەکانیان کراوە ، بەڵام ئەو کارەو هیچ ، لە چاو رێزو پلەی ئەو شاعیرانەدا ، ئەگەر برایش نەبن خزمن .

ئەوەی گەلێ جار باسم کردوەو ئەم جارەیش دەیلێیمەوە ئەوەیە ئەوەی رۆیی - رۆیی ، لەگەڵ رابوردوو هیچ ناکرێ ، بەڵام ئێستەیش نەچوە بچێو ، لەوانەیە ئەگەر قۆلی مەردانەی لێ هەلمالرێو ، هەولی پیاوانەی بۆ بدرێ گەلێ شت بکرێت • بەڵگەی ئەم قسەیشم ئەم دیاری‌یە بچکۆلەی ئەم جارەمە کە بریتیە لە بەرهەمی کۆمەلێك لە شاعیرە ناودارەکانمانو تا ئێستە باخچەی ئەدەبی کوردی لە بۆنو بەرامەیان بێ بەش بوەو خوێنەرانی کوردیش لە هەوالیان بێ ئاگا بوون • دیارە ئەمەیش دواقۆناغ نیەو ، وەك دەلێن ( مەیدان مشك نەیخواردوە ) •

بەڵام کێ ئەم کارە بکات ؟ کێ لە خۆشیو رابواردنو ئاسوودەیی ژیان دەبوورێ ؟ کێ ئامادەی ئەوەیە شەونخوونیی زۆرو ، شەودانەدەمڕۆژو، خۆماندووکردنو ، چاو کزکردنو ، قایل‌بوون بە گۆشەگیریو ، دوورگرتن لە کۆڕو کۆمەلی هاوەلانو دۆستانو ، تەنانەت وازهێنان لە بەشێکی ئەرکی مالو منداڵیشی بکا بە پۆیلانەی بووکی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ؟ - بە کورتی - کێ‌هەیەخۆی بۆ بووژاندنەوەو زیندوکردنەوەی سامانی کەم وێنەی باو باپیرانمان تەرخان بکات ؟

بۆ وەلامی ئەم پرسیارەیش - بەداخەوە - گۆڕەپانەکە چۆل دەبینینو، شارەزاو لێهاتووی ئەوتۆمان نیە بیر لەو زیانە گەورە بکاتەوە کە بە کەمتەرخەمیکردنی ئێمە لە سامانەکەمان دەکەوێتو ، تا لێیشی‌بوەستین دێرتر دەبێتو ، تا چاوەڕوانی ئەمو ئەو بین فرەتر لە ژیانو بەسەرهاتو بەرهەمیان لە کیس دەچێ •

● وەك دیاردەیەکی شایانی باسی ناو ئەم بەرگەیش جگە لەوانەی لەوێو لێرە ئیشارەم بۆ کردوون ، دەبێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشم کە کاتێ ئەم شاعیرانە ئەم شیعرانەیان گوتوە باوی شیعری سیاسیو نیشتمانی نەبوەو ، ئەم شاعیرانەیش ویستوویانە لە هەر بابەتێكو دیمەنێكو رووداوێك هۆیەك

دروست‌بکەن بۆ ئەوەی شیعری پیا ـیا تیا ـبلێن • ئەو جۆرە شیعرانەیش گەلێ جار دەچنە قالبی چیرۆکەوەو وەك کورتە چیرۆك خۆیان دەنوێنن •

● لەم بەرگەدا زیاتر لە بەرگەکانی پێشوو هەولی ئەوەم داوە نوسخەی جیاـجیا پەیدا بکەم‌و شیعرەکان باش‌و راست‌و دروست بنووسمەوە ، بەلام ئەم ئارەزووەیشم لە هەموو لایەکدا نەهاتوەتە دی‌و ، گەلێ جار شیعرەکانم بە گومانەوە نووسیوەو ،هەندێ جاریش وەك مەتەل هەلهێنان هەندێ رووی نووسینەوەی شیعرەکانم لـە کەشکۆلەکان وەرگرتوەو ، لەوانەیە رووی دیکەیش هەلبگرن ، بەلام هەرچیم پێکرابێ هیچ درێغیم نەکردوەو هـەر ئەوەم پێکراوە کە کردوومە ، یارمەتیدانی مامۆستا محمدی مەلا کەریمیش لـەگەل سەرجەمی ئەم بەرگەدا بەردەوام بوە •

● ئەگەر کات‌و دەرامەتی رەسا هەبوایەو ، پســـپۆڕو شـــارەزای خۆتەرخان‌کردوو بۆ ئەم کارە هەبوایە ، راست‌و دروستتر ئەوە بوو ئـــەو کەشکۆلانەی لێرەدا باسیان دەکەین‌و شتیان لێ وەردەگرین‌و تا ئێستە لە بواری کەلەپووردا ناویان نەبیستراوە ، بێ جیاوازیی‌و جیاکردنەوە یەکەیەکە هەموویان چاپ بکرایەن‌و بخرایەنە بەردەستی خـوێنـەران‌و شەیدایـانـی ئـەم بابـەتانـە •

# کورته باسێکی ئەو کەشکۆڵانەی لەم بەرگەدا سوودیان لێ وەرگیراوە

### کەشکۆلی قادری شێخ صەمەد ( سەلەسیی )

**- ١ -**

دۆزینەوەی هەر کەشکۆڵێکی کوردیو ، زڕاندنی ناویو ، باس‌کردنی ناوەرۆکیو ، لێکۆڵینەوەی ناواخنـــەکەیو ، بـەراوردکـردنی لـەگـەڵ کەشکۆلەکانی دیکەداو ... هەنگاوێکی نوێیە لە سەر رێگەی پیـرۆزی بەرهەم‌کۆکردنەوەو ، شوێنەواردۆزینەوەی دەیان شاعیری گەورەو وتـار شیرینو زمان‌پاراوی گەلەکەمان ، کە دەیانو صەدان ساڵ لەمەوبەر بە زمانی شیرینی کوردی شیعریان هۆنیوەتەوەو ، ملوانـــکەی زێڕینی وشـــەی کوردیان بە دیاریی دەستی خۆیان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان هەڵگرتوە •

هەرچەند زیاتریش بگەڕێینو وردتر مەودای پشکنین فراوان بکەین رووتر بۆمان دەردەکەوێ ـ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەندازەی بەرهەمی لەناوچوو کەشکۆلی فەوتاومان نازانراێو لەوانەیە زۆر سەرسام‌هێنەر بێت ـ کە تـا ئێستە زۆر کەشکۆڵو بەرهەمی بە بایەخی دوورەدەستو ناونەبیـــراوو بوخچەی نەکراوەی ئەدەبی کوردیمان هەن لە سووچو قوشبنی کتێبخانـە گشتیو تایبەتی‌یەکاندا ، بێ نـــازو لـــە ژێر تۆزو خـۆڵـی لەبیرکردنو کەمتەرخەمیی رۆشنبیرانی کورد لە ئاستیاندا دەیان مەترســـی گـــەورە هەڕەشەی لەناوبردنیان لێ دەکاتو ، بـە لەناوچوونیشیان ئـەو بـەشـە گەورەیەی سامانی کەلەپوورو زمانو مێژووی گـــەلەکەمان ـ وەك ئـەو هەموو سامانەی کە لەمەوبەر لەناوچوون ـ بـۆ یەکجاریی زیندەبەچاڵ دەکرێتو زیانێکی دیکەی قەرەبوونەکراوە لە گەلەکەمان دەکەوێت •

لەم رووەوە زۆر گۆتراوە ، تا زیاتریش بگوترێ‌و ئەو مەترسییانە دەست‌نیشان‌بکرێن هەر جێگەی خۆیەتی‌و زیاد نەگوتراوە .

بەڵگەی ئەم جارەی ئەم باسەمان کەشکۆڵێکی دیکەی رەنگینی شاعیرانی کوردمانە کە ـمن پێ بزانم ـتائێستە هیچ رۆشنبیرێکی کورد باسی نەکردووە ، لە قۆناغەکانی پێشووی بڵاوکردنەوەو لێکۆڵینەوەی بەرهەم‌و دیوانی شاعیرانی کورددا سوودی لێ وەرنەگیراوەو ، نەبوونی ئەم سەرچاوە لە بەردەستی لێکۆڵەرەواندا زیاتێکی گەورەیە لە ئەدەبی کوردی کەوتووە، کەلێن‌و کەلەبەری پڕنەکراوە کەوتۆتە دیوانی شاعیرەکانمان .

ئەم کەشکۆڵە یەکێکە لە کەشکۆڵە رەنگینەکانی گەنجینەی دەستخەتە کوردی‌یەکانو ، نووسەرەوەکەی ژیرانەو زیرەکانە بە پشوویەکی قووڵەوە ،بەرهەمی کۆمەڵێك لە کەلەشاعیرانی گەلەکەمانی بە قەڵەمە ناسك‌و بە برشتەکەی بۆ پاراستووین . ئەوەی جێگەی خۆش‌بەختی‌و بەختەوەری‌یە ئەوەیە ئەم نووسەرە بەرێزە گوڵچنێکی هۆشیارو هەستیار بووەو ، زانیوەتی هەڵاڵەو بۆن‌و بەرامەی باخچەی کام شاعیر شیاوی هەڵمژین‌و هەڵگرتن‌و کۆکردنەوەیە . ئەوەتا دەبینین لە بەرهەمە رەنگینەکەی‌دا بایەخی زۆری بە شاعیرانی وەك : مەولەوی‌و ، نالی‌و ، کوردی‌و ، صەیدی‌و، بێسارانی‌و ، ئەحمەدی کۆرو ، خاناو ، ئەحمەدبەگی کۆماسیی‌و ... داوە.

هەروەها ئەوەی لە نرخی رەنجی ئەم سەربازە نەناسراوەی مەیدانی کەشکۆڵ‌نووسینەوە زیاد دەکات ئەوەیە کە : نووسەر خەتێکی جوانی بووەو ، لە چاو هەندێ کەشکۆڵی دیکەدا هەڵەی نووسینەوەی کەمەو ، لەمەوە دەردەکەوێ کە کۆڵکەمەلاو نیمچە خوێندەوار نەبووەو ، شارەزای مەیدانەکە بووەو ، توانای باشی بەسەر کارەکەی‌دا شکاوە .

ئەوەی جێگەی داخە ئەم نووسەرە بەرێزە لە درێژایی‌و پانایی کەشکۆڵێکی (٣٠٠) سێصەدو ئەوەندە لاپەڕەیی‌دا خۆی پێ نەناساندووین‌و،

مێژووی نووسینەوەی کەشکۆڵەکەو ، شوێنی تێدانووسینەوەی ، بۆ دیاریی نەکردووین • ئەوەندە نەبێ کە هەندێ جار لە کۆتایی هەندێ پارچە شیعردا داخ‌و ناسۆری دووری‌و خەفەتی خۆی دەردەبڕێت‌و ،جارجاریش باسی وەباو نەخۆشیی دەکات‌و ، دۆعای پاراستن لە وەبا دەکات •

گەلێ جار ئەوەندە دەنووسێ کە بە دەستی قادری سەڵەسیی نووسرایەوە • تەنها یەك جار لە لاپەڕە (٢٠)دا نووسیویە : « تمت شد از دست ••• قادر پسری شیخ صمد سلسی الاصل در قریهٔ اسراباد ، در حالت عجزو پریشانی » واتە : ( ئەو بەشە یا ئەو پارچە شیعرە ) بە دەستی قادری کوڕی شێخ صەمەدی خەڵکی سەڵەسیی‌لە دێی ( اسراباد )لە حاڵەتی پەستی‌و پەریشانی‌دا نووسرایەوە •

بەڵام خۆش‌بەختانە لە لاپەڕە (١٩٢)دا دەبینین مەلایەك یا فەقێیەك . سا بە دیدەنی یا بە هاوفەقێتی ڕێگای کەوتۆتە لای مامۆستا مەلا قادرمان‌و چەند شیعرێکی بۆ یادگار لە کەشکۆڵە ڕەنگینەکەی‌دا تۆمار کردوەو ، لە کۆتایی‌دا ئەوەندەی بۆ تۆمار کردووین کە مێژوویەکی نووسینەوەی کەشکۆڵەکەی لێ دەردەکەوێ ، ئەمەیش نووسینەکەیەتی :«تحریر پزیرفت جهة ارجمند أعز جناب شیخ قادر سلسی الاصل ١٣٢٢ » واتە : لەبەر خاتری بەڕێزو خۆشەویست جەنابی شێخ قادری خەڵکی سەڵەسیی نووسرایەوە • ( ١٣٢٢ ) •

ئەم کەشکۆڵە درێژکۆڵەیەو لە شێوەی (بەیاض)دا نووسراوەتەوەو پێوانەکەی (٢٠×١١)یەو ، ژمارەی دێڕی لاپەڕەکانی وەك یەك نییەو ، بە خەتێکی وردی شکستە نووسراوەتەوەو ، بەرهەمی ئەم شاعیرانەی تێدایە : مەولەوی ، ئەحمەد ، ئەحمەدی کۆر ، مەحموودی حەمەپاڵەوان ، نالی ، صادق ، وەفایی ، حەریق ، فەخرولعولەما ، عەبدوللابەگ ، شێخ محەمەدشەریف ، خانای قوبادیی ، فەقێ خەلوزیی ، مەلا ئەبوبەکری موصەننیف ، شێخ شەهاب ، زووخالی ، شەفیع ، ئەحمەدبەگی کۆماسیی،

بێسارانی ، صەیدی ، مەهجووری ، شەمسی تەبرێزی ، شێخی جیلانی ، حەزینی ، فیکری ، کوردی ، بەلآیی ، مەلا عەزیزی نەغەدەیی ، کەلیم ، فەوزیی ، قازی فەتاحو ئەتابەگ ، ئاهی ، سەیدصادق ، مەحموود، سەعدیی، عەبدوڕەحیم ، شێخ ئەمینی شێخ فەتاح ، مەحروومیی ، شێخ ڕەزا ، حەسەنو ئامینە ، ناریی ، شێخ عەبدوڕەحمان[ی جانەوەرەیی] میرزا وەلەوخان ، مەولانا خالید ، سەید محەمەدی خانەقا ، وەلی دێوانە ، قادر پاوەیی ، عەبدولکەریم ، یوسف یاسکە ، مەحزوون ، میرزا یەعقووب ، ...

کە جارێکی دیکەو لە روویەکی دیکەوە چاوێکی دیکە بەم کەشکۆڵەدا بخشێنینەوە چەند لایەنێکی وا دەبینین کە دەبوو وا نەبن و ، دەکرا بە شێوەیەکی دیکە بن و ، ئەو کاتە چەند ئەوەندەی ئێستە سوودی زیاتر لەم کەشکۆلە وەردەگیراو ، کەشکۆلەکەیش زۆر لە ئێستەی رەنگینتر دەبوو . لەوانە :

١ـ لە هەندێك لە کەشکۆلەکاندا ناوی شاعیرەکانو موناسەبەی وتنی شیعرەکان نووسراوەو ، بەم کارەیش زانینی مانای شیعرەکانو تامو چێژلێ وەرگرتنیان زۆر ئاسان دەبێت . بە داخەوە لەم کەشکۆڵەدا ئەم هەلە لەکیس چوەو ،ئەم لایەنە بە بایەخە بوێرراوە .

٢ ـ نەنووسینو جیانەکردنەوەی سەرجەمی بەرهەمی هەر شاعیرێك، وەك بلێین کە دەستی کرد بە نووسینی شیعرەکانی مەولەوی تا لێیان نەبێتەوە نەچێتە سەر شیعری شاعیرێکی دیکە . ئەمەیش لێرەدا کەمەو ، هەندێ جار بوە بە هۆی ئەوەی دووپات بوونەوە لە نووسینەوەی بەرهەمی یەك شاعیردا رووی داوە .

٣ ـ لەبیرکردنو نەنووسینی ناوی شاعیرەکان لە کاتی نووسینی بەرهەمەکانیانا ، واتە کاتێ لە بەرهەمی شاعیرێك دەبێتەوەو دەست بە بەرهەمی شاعیرێکی دیکە دەکات ، جاری وا هەیە ناوی شاعیری دوەمی

لـەبیر دەچێتو ، بەمەیش ئەگەر خوێنەر زۆر وریا نەبێتو ، شارەزای بەرهەمی شاعیرەکان نەبێت ئەوا تێکەڵبوونو ئاڵۆزیی روو دەدات •

ئەم کەشکۆلە دەستخەتی ژمارە (٨٢٨١)ی کتێبخانەی ( دار صدام للمخطوطات ) ••

## کەشکۆلی ئەحمەدی برالـە

**- ٢ -**

یەکێکی دیکە لەو سەرچاوانەی لـەم بەرگـەدا سـوودم لـێ وەرگرتوونو ، تا ئێستە باسیم نەدیـوەو نەبیستوە دەستخەتـی ژمارە(٢٢٢٥٣)ی (دارصدام للمخطوطات)ە •

ئەم دەستخەتـە کەشکۆلێکی نایابی هەمەرەنگـەو ، شـیعری کۆمەڵێك شاعیری کوردو فارس‌و عەرەبی تێدایـەو ، سالـی (١٢٤٥)ی کۆچیی ئەحمەدی براله نووسیویەتیەوە بۆیە منیش ناوم نا ( کەشکۆلی براله ) ، (٢٠٠)لاپەڕە زیاتـرەو ، کاتی خـۆی شیرازەی پساوەو دوایی کە جزوبەند کراوەتەوە هەڵە لـە جزوبەندەکەیـدا کراوەو پـاش‌وپێش‌و تێکچوونو لەناوچوونی تێدا پەیدا بوە •

ئەم دەستخەتەیش وەك زۆر لە کەشکـۆلەکانـی دیکەی سامانـی کەلەپووری ئەدەبی کوردی بەڵگەیەکی روونی زیانـی قەرەبوونەکراوەی ئەم سامانە بەنرخەیەو ، لێرەدا ناوو بەرهەمـی کۆمـەڵێك لە شاعیرانـی کورد دەبینین کە من پێ بزانم تا ئێستە نەبیستراونو باسیان نەکراوە •

دیارە ئەمەیش لەوانەیە مشتێك لـە خەروارێك بێـتو نموونەی زۆر لەمە زیاتر چاوەڕوانی بووژاندنەوە بێت •

لە ئەلقەی (٢٨)ی زنجیرە وتـاری (بەرەو پـرۆژەی دەستخەتـە کوردی‌یەکان)دا وتارێکم لەسـەر ئەم دەسـتخەتە نووسیوەو زیاتـر ناوەرۆکەکەیم شی‌کردوەتەوە •

## کەشکۆڵی محەممەد ئەمین

**- ٢ -**

ئەم کەشکۆڵەیش یەکێکە لە کەشکۆڵە نایابو کەم‌وێنەکانی سەرچاوەی سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردیو ، بە ژمارە (١٣٩١٦) لە کتێبخانەی (دارصدام‌للمخطوطات)دا جێگەی خۆی گرتوە •

مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی بەتنا -خاکی- ئەم کەشکۆڵەی لە دەورو بەری ساڵانی (١٣٠٥-تا-١٣١٣)ی کۆچیو دوای ئەو مێژوەدا نووسیوەتەوەو ، تێکڕای کەشکۆڵەکە کە (٤٨٦)لاپەڕەیە ، چەند جێگەیەکی نەبێ کە یەك دوو هاوڕێی مامۆستا بۆ یادگار تیایاندا نووسیوە •• بە دەستخەتی مامۆستا خۆیەتی •

مامۆستا خاکی بە چوار زمان -عەرەبی ، فارسی ، تورکیی ، کوردی- کەشکۆڵەکەی نووسیوەتەوەو ، لە زمانی کوردیشدا شارەزای شێوەزارەکانی کرمانجی خواروو ژووروو ، شێوەی گۆرانیی بووەو، کەشکۆڵە ڕەنگینەکەی بە بەرهەمی شاعیرانو ، نووسەرانو ، حەکیمانو ، مەلایانو ، نوشتەنووسانو ، نوکتەزانانو ، فەتاحفاڵانو •••تاخنیوەو، کە دەمی کەشکۆڵەکە واڵا ئەکەیتەوە نازانی سەیری چی بکەیتو ، باسی چی بخوێنیتەوەو ، وەك دەڵێن سەری ماری کوێری تێدایە !

مامۆستا خاکی لەگەڵ ئەوەیشدا کە خۆی خەڵکی ناوچەی هەولێر بوەو ، بەشی زۆری ژیانی لەوێ بەسەر بردوە ، کەشکۆڵەکەی تایبەتی بەرهەمی زاناو نووسەرو شاعیرو •••ی ئەو ناوچە نیەو ڕەنگدانەوەی ئەو بابەتانەی ناو هەموو کوردستانەو ، نەك هەر کوردستان بەڵکو سنووریشی شکاندوەو ، ڕەنگدانەوەی ئەدەبو دابو نەریتی گەلانی دراوسێو ، بگرە دوورەدەستانیشەو ، پابەندی زێدو ، لایەنو ، بیرو ، ڕێبازو •••ی ناوچەیەك نیە ، لەگەڵ بەرهەمی شاعیرانی هەولێرو موکریانو

باتەو جزیرو بۆتانو۰۰۰دا بەرهەمی شاعیرانو نووسەرانی ناوچەکانی: سلێمانیو ، هەورامانو ، ئەردەڵانو ، گەرمیانو ، کرماشانو ۰۰۰ی تێداکۆکردوەتەوە ۰

دیاردەیەك کە جێگەی سەرنجو بایەخە لەم کەشکۆڵەدا ئەوەیە کە ئەم مامۆستا بەرێزە لە ماوەی کارکردنی لە کۆکردنەوەی کەشکۆڵەکەیدا لەو بابەتە باوو ناسراوانە لای داوەوە گەلێ بابەتی کەم وێنەی ئاخنیوەتە کەشکۆڵە پڕو پڕ بەهاکەی لەوانە : لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا بە پیاوو ئافرەتی حەکیمی کوردستانەوە گەڕاوەو ، لێیپرسیونو ، ئەو داوو دەرمانانەی ئەوان بۆ گەلێ دەردو بیماری بەکاریان هێناوەی جیاجیا نووسیوەو ، لە دوای هەر بابەتێکیشیانەوە ناوی خاوەنەکەی نووسیوە ، بەمە ناوی کۆمەڵێك بلیمەتو بە توانای مەیدانی پزیشکیی گەلەکەمانی بۆ پاراستووین کە رەنگە ـ لەم کەشکۆڵەدا نەبێ ـ کەس ناوی نەبیستبێو نەیانزانێ ۰

پێوانەی ئەم کەشکۆڵەیش (۲۰×۱۲) یەو لاپەڕەی (۱۸)دێڕو زیاترو کەمتری تێدایە ۰

## کەشکۆڵی ئەلالە

— ٤ —

ئەم کەشکۆڵە پاشماوەی کەشکۆڵێکی نایابی سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردییەو ، لە کتێبخانەی (دارصدام‌للمخطوطات)دا لە ژێر ژمارە (۱۱۸۰۱)دا پارێزراوە ۰

ئەم کەشکۆڵە ئێستە (۱۹۲) لاپەڕەی ماوە ، بەڵام بە گوێرەی چەند بەڵگەیەك کە دەیاننووسم وای بۆ دەچم کە کاتی خۆی زۆر لەمەی کە ماوە زیاتر بووبێ ، چونکە :

یەکەم : ئەو ژمارانە کە بۆ لاپەڕەکانی دانراون تازەو ، بە قەڵەمی

لاپەڕەکانی ( ١١ × ١٩ ) و ، لاپەڕەی وا هەیە (١٥) دێڕی تێدایەو لاپەڕەی وایش هەیە (١٢) دێڕی تێدایەو ، لاپەڕەی وایش هەیە (١٨)و واتە کەمو زۆریی لە ژمارەی دێڕەکانی لاپەڕەکاندا هەیە •

## کەشکۆلی عەبدوڕەحمان

– ٥ –

ئـەم کەشکۆلـە دەســـــتخەتی ژمـارە ( ٣٠٩٣٠ )ی کتێبخانەی (دارصدام للمخطوطات)و ، لە شێوەی (بەیاض)دا نووسراوەتەوە

پێوانەکەی (١٩×١٠)و ژمارەی دێـڕی لاپەڕەکانی وەك یەك نیە • مێژووی نووسینەوەی دەستخەتەکەیش بە روونی نازانین ، بە گوێـرەی شیعری ئەو شاعیرانەی نـاوو شیعریان لە دەستخەتەکەدایە دەبێ تەمەنـی کەشکۆلەکە (٨٠–٩٠)ساڵ بێت •

دوو سێ کەس کاریـان لـە نووسینەوەی کەشکۆلەکەدا کـردوە ، یەکێکیان ناوی (محەمەدصالح)بوە ،ئەمەیان تا ئـەندازەیەك خەتی خـۆش بوەو ، خوێندەوار دیارە • ئەوی دیکەیان ناوی (عورمەر ئەربیلی)یە ، ئـەم نووسەرە کۆلکەخوێندەوار بوەو ، خەتیشی ناخـۆش بوە بە داخـــەوە ، کەشکۆلەکە جێگەی متمانە نیەو ، هەڵەی زۆری تێدایـەو نوسخەیەکــی دیکە نەبێ کە پاڵپشتی ئەمەی پێ بکرێ سوودێکی ئەوتۆ نابەخشێ •

لەم کەشکۆلەدا ناوی چەند شاعیرێکی کورد هاتوە ، من پێ بزانـم، تا ئێستە شیعریان بڵاو نەکراوەتەوەو ، چینی خۆێندەواری ئەم سەردەمـە ناویان نەبیستوون •

کەشکۆلەکە (١٨٠) لاپـــەڕەیەو ، شیعری ئەم شاعیرە کوردانـــەی تێدایە : زەبوونیی ، میرزا شەفیع ، ئەحمـەدی کۆر ، مەلا وەلەوخـــان ، طالیع ، مەخمووریی ، وەلیدێوانە ، کوردی ، رەنجووری ، نالی ، فەقـــێ

ڕەصاص نووسراونو ، ڕەنگە کاتی فرۆشتنی کەشکۆلەکە ئەو ژمارانەی بۆ دانرابێتو ، کاتی خۆی ئەو ژمارانە نەبووبن •

دوەم : لە شیعرەکانی (نالی)دا وا دەردەکەوێ کە پێشتر بـەش‌بـەش بوەو ، بە بینێکی درێژەوە مشت لـە نووسینەوەیان گیراوەو ، لـەوانەیە هەموو – یان بەشی زۆری – شیعرەکانی ئەم شـاعیرەی تێدا بوویێـــت ، چونکە لە جێگەیەکدا نووسراوە : ( باب الهاء )و دوای ئەوە ئیتر ئـەو شـێوە نابینین •

سێیەم : لە ســـــەرەتـای شـــیعرەکانـــی(سالم)دا نووســــــراوە: (کلیات‌سالم)بەڵام ئەوەی لە کەشکۆلەکەدایە هـــەموو شیعرەکانی ســالم نیە •

چوارەم : ئەو ژمارانەی کە لەسەر لاپەڕەکان نووسراون شپرزەنو زنجیرەیان تێك‌چوەو ، لە چەند جێگەدا سەرەتای پارچە شیعر دیارەو ، بـە بڕانەوەی لاپەڕەکە پارچە شیعرەکەیش ناکام دەبێتو ، لاپەڕەی دوایی شتێکی دیکەی تێدایە کە پەیوەندیی بەمەوە نیە •

ئەم کەشکۆلە بەرهەمی ئەم شاعیرانەی تێدایە : کوردی ،نالی سالم ، حەریق ، ئاهی ، خەستە ، کەیفی ، مەحـوی ، صابیری •

لە کۆتایی ئەم کەشکۆلەدا نووسراوە کە مەلا محەمەدڕەشیدی کوڕی مەلا عەبدوللای گەلاڵە لـــە مێژووی (١٣١٩)ی‌کدا لەبەر خاتری بــــرای بەڕێزو خۆشەویستی مەلا محەمەد شەریف نووسیویەتیەوە • بەڵام لە لاپەڕە ٦٩دا کە شیعرەکانی ئاهی تەواو دەبن نووسراوە :«تمت از ید حقیر سراپـا تقصیر عبدالله الکلالەء غفر الله له ولوالدیه ولناظریه • آمیـن» لــەمـەوە دەردەکەوێت کە کەشکۆلەکە کەشکۆلی مەلا عەبدوللای گەلاڵە بـــوەو ، پاش خۆی لای نەوەکانی ماوەتەوە ، نەوەکانیشی ڕێگەی باوکی خۆیـــان ونەکردوەو ، ئەدەب‌دۆستو شەیدای بەرهەمی شاعیرانی کورد بوون •

کەشکۆلەکە لـە ســــەر شێوەی (بەیاض) نووسـراوەتەوەو ، پێوانـــەی

عەبدوللا ، عەلی ، شێخرەزا ، فونوونی ، خانای قوبادی ، یێسارانی ، مەولەوی ، حاجی ... جگە لەمانەیش بەرهەمی چەند شاعیری فارسی تێدایە .

سەرەتای ئەم کەشکۆلە مەولوودنامەکەی شێخ حسەینی قازی‌یە ، کۆتایی‌یەکەیشی ، کە خۆی لە خۆیدا ناتەواوە ، بەم پارچە شیعرەدێت:

(یارسول‌الله) دڵ جە غەم خەستەم
مەعلوول بە عیللەت عیصیانەن جەستەم
پشت بە بار غەم هیجران شکستەم
پایەی عیصیانم جە حەد ویەردەن
غەیر جە بەدکاریی خاسیم نەکەردەن
بەو شاکە قەییووم قایم بە ذاتەن
میزان جە وەزن گوناى من ماتەن
جەهەنەم جە تاوم شین‌و زاریشەن
جە خەوف گونام بێ‌قەراریشەن
جەحیم جە کردەم [سارختشن!]
جە دیدار من حاشای سەختشەن
ساعیقەی سەقەر جە نامش کەفتەن
جەو ساوە سەدای گونام ژنەفتەن
هەرکەسێ چون من گوناش بۆ (!)
مبۆ جە مەحشەر [حاشی‌حشی!] بۆ
موهیم لوطف تۆ سەیید موختار
پەنای عاصیان بەندەی گونەهکار
بە بێ سەرپۆشی خانە پڕ طەریق(!)
بە تۆ مبەخشان خەڵقان رۆی مەحشەر

وەرنە رووگەردان رۆی قیامەتم
شەرمەندەی دیوان قابی رەحمەتم
(زبرەمحمدصالح)

ئەم کەشکۆلە جگە لەوەی کە ناوی ئەو دوو نووسەرەی تێدایـــە ، لە چەند جێگەدا مۆری (عبدالرحمن)ێکــی پێوەیـە ، بۆیـــە نـــاوی (کەشکۆلی عەبدوڕەحمان)م بۆ دانا • دوا دەسیش کە ئـــەم کـەشکۆلەی دیوە ، پێش ئەوەی لەم کتێبخانەدا بگیرسێتەوە ، دەستی فاضیل فەتحولــلا عەبدولعەزیز محەمەدێك بوە ، هەر لە پالی ناوی ئـــەم دوو کەسەیشـــدا یادگاری (صالحجاف)ێك دەبینرێت •

## کەشکۆلی شـێخ مەحمـوود

- ٦ -

ئەم کەشکۆلــە دەســـــتخــەتــی ژمـــارە(١٦٦٨٩)ی کتێبخانەی (دارصدامللمخطوطات)و ، ناوی لێ نەنرابـوو ، بەلاّم من دوای ئـــەوەی دیم لە کۆتاییدا محەمەد ناوێك ئەلێ : لە بەر خاتــری مامۆستام شـێخ مەحموود نووسیمەوە ، ناوم نا (کەشکۆلی شێخ مەحموود) •

ئـەم کەشکۆلــە نزیکەی (٢٠٠) لاپـەڕەیەو بـە بابـەتی هەمەجـۆر لە:نامەو ، بابەتی ئاینیو ، دۆعاو •••ئاخنراوە • بایەخێکی زۆری بە نامەکانی مەولانا خالیدو شێخانی طەریقەی نەقشبەندی تێـدا دراوەو ، بە خەتێکی جوانو راستو دروست نووسراوەتەوەو ، یەك دوو نامەیم لەگەل نامەکانی ناو (یادیمەردان)ی مامۆسـتا مەلا عەبـدولکەریمیمودەڕیســدا بـەراورد کرد بۆم دەرکەوت کە ئەم نوسخە گەلێ جار لە ســـەرچـــاوەکانی ئەوێ پوختو رەوانترە •

پێوانـەی ئـەم کەشکۆلە (٢٠×١٣)یەو ، ژماری دێرەکـان کـە لـە لاپەڕەکاندا نووسراون وەك یەك نیەو ، بە زۆریی لاپـەڕەی (٢٠)دێـــڕو زیاترو کەمتری تێدایە •

# کێبەرکێ یان لاسایی‌کردنەوەو بیرۆك لەیەکتر وەرگرتن

ئەوەتی خولیای کۆکردنەوەی کەلەپووری ئەدەبی کوردی‌و بەرهەمی شاعیرانی کۆنمان کەوتوەتە مێشکەو ، وردەـوردە لەم بوارەدا خەریـــك بووم هەستم بە لەیەکچوونو نزیکی بیرو مانا لە نێوان بەرهەمی شاعیراندا کردوەو ، هەر لە یەکەم قۆناغی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی شاعیرانیشەوە ئەم راستیەم درکاندوە .

ئــەم باسە ـوەك زۆر لە باسەکانی دیکەی ئەدەبی کوردیـ هێشـتا هیچی ئەوتۆی بۆ نەکراوەو ، کەسم نەدیوە قووڵ لەم بوارەدا رۆچوویێ‌و بە نموونەی جۆراوجۆرو ، لێکۆڵینەوەی پشت‌بەستوو بە بەڵگەو بناغـەی پتەوو سەرچاوەی باوەڕپێکراو ئەم لایەنـەی شیی‌و یەکـــاڵا کـــردبێتەوە ، منیش کە لێرەدا لە دەرگای ئەم بابەتە دەدەم بە هیوای ئەوەوە لێی نـــادەم کە لەم دەرفەتەدا قووڵ دەست داگرم‌و باسەکە یەکسەرە بکەمەوە . بـەڵام ئەوەندە هەیە لەم ماوەدا کە خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمی شاعیران بووم‌و کەشکۆڵەو کەشکۆڵی زۆرم کردوەو ، شیعری جیاجیای کۆمەڵێـك لـــە شاعیرانمانم دیوەو ، هەندێکیانم یەك‌خستوەو هەڵم‌سەنگاندوون زیاتـــر ئاسۆی ئەم باسە لە جاران بـــە روونی دەبینم‌و ، نموونەگـەلـی فرەتـــرم بەدەستەوەیەو ، رەساتر دەتوانم ، بـۆ ئەمەولا ، کەرەســـەی ئەم بابەتـــە دیاری بکەم .

لە سەرەتای بەرگی یەکەمی ئەم پرۆژەدا ـکەشکۆڵی کەلەپـــووری ئەدەبی کوردی ـباسی ئەوەم کرد کە کاری من لەم قۆناغەدا وەك دروێنەو

کۆکردنەوەی بەروبوومی کشتوکاڵو خەرمانداناو وایەو ، بەشی خەرمانکوتانو ، شەنوکەوکردنو ، خەرمانهەڵگرتن ، بۆ هەلو دەرفەتێکی دیکە هەڵدەگرین • هەر لەبەر ئەمەیش بوە زۆر بە پێویستم نەزانیی ـ خۆم لە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی دەقو بابەتەکانی ناو بەرگەکانی پێشوو لادا‌وەو ، بە کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەیان دەستبەردار بووم •

بەڵام کاتی وا هەیە بابەتو دەقی وا دێتەپێشەوە ئەگەر هەندێك روون نەکرێتەوەو ، لایەنە جۆراوجۆرەکانی باس نەکرێن لەوانەیە ئەو هەلە لەکیس بچێ کە ئەو بابەتانە سوودی خۆیان بگەیەننو ، هەندێ لەو ماناو مەبەستانە کە لەو بابەتانە وەردەگیرێن بەسەر بەشێك لە خوێنەراندا بڕۆنو ، دواتریش ئەو دەرفەتە نەگونجێتەوە کە وەك پێویست لەسەریان بنووسرێ •

ئەوەی من گەلێ جار هەستم پێکردوەو چەند جاریش لە بواری خۆیدا باسم کردوە ئەوەیە شاعیرانی پێشوومان شێوەیەکی تایبەتیی خۆیان لە کێبەرکێو نواندنی تواناو دەستەڵاتی بیرو قەڵەمیاندا هەبوەو ، ئەوەی لای گەلانی دیکە بە (سرقات‌شعریة)شیعردزین دادەنرێت لای ئەمان روانگەیەکی دیکەی هەیەو ، وەك لەم نموونانەدا کە دەیانهێنمەوە دەردەکەوێت ، ئەوە بە لەکە دانەنراوە کە شاعیرێك ماناو مەبەستی شاعیرێکی دیکە ، هەر بە وشەو کێشو سەرواکانی ئەوەوە بێنێ ، بە مەرجی ئەوە ئەم بتوانێ لە هەندێ روەوە رواڵەتێکی تازە ، یان مانایەکی ناسکتر بە لایەنێ ، یان چەند لایەنێکی ئەو ماناو مەبەستە بدات کە شاعیری پێشوو ئەسپی بیری خۆی تیا تاوداوە •

لێرە بە دواوە چەند دەق دەخوێنینەوە کە هەر یەکێکیان دەقی شاعیرێکەو رەنگە هەر یەکتریشیان نەدیبێ ، بەڵام لەوانەیە ئاگایان لە شیعرو بابەتو بەرهەمی یەکتر بووبێو ، ئەوەی دوایی ویستبێتی شان

له شانی ئەوەی پێش خۆی بداو ، کێبەرکێی لەگەڵ بکــاو ، ئــەوەی دواتریش لەگەڵ ئەوەی پێش خــۆی‌دا ...ئێمە سەرنج بۆ مەبەستەکــە رادەکێشین‌و ، نموونەکان دەخەینــە روو ئیتر هەڵسەنگاندنیان‌و ، باســی ئەوەی کامیان گۆی هونەری لە کامیان بردوەتەوە ئەخەینە ئەستۆی چین‌و بەرەی ئەمەولای رۆشنبیرانمان .

یەکەم نموونەی ئەم مەبەستە بەرهەمی چوار شاعیرمانە کــە بە پــێی ئاگاداری من دوانیان تا ئێستە بــــڵاونەکــراونــەتــەوەو ، دوانیشـــیان بڵاوکراونەتەوە ، بۆ ئەوەی هەر چوار دەقەکــە بەیەکەوە لە بەردەســتی خوێنەران‌دا بن ، دوانە بڵاوکــراوەکەیشــ لێرەدا جــارێکی دیکـــە بڵاودەکەینەوە .

دوای ئەوەیش کە لەم دەرفەتەدا چەند نموونەی باسەکە دەخەمە روو مانای ئەوە نیە ئەمە هەموو ئەو بابەتانەیە کە دەیانزانم‌و لە بەردەستدان ، بەڵکــو دەمەوێ ئەوە لە خۆینەری ئازیز نەشارمەوە کە گەلێ نموونەی دیکە لـــە دەستدان‌و ، جارجار لە پەراوێزەوە ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکــەم‌و ، لێرەدا پێشەکی وەك نموونە خۆینەری ئازیز بۆ لای بابەتگەلی دیکە رێنــومایی دەکەم‌و ، خۆی دەتوانێ بە هەندێ پشکنین‌و ماندوبوون وێنەی زۆریـــان لێ کۆبکاتەوە ، لەو بابەتانە : بای شەمــاڵ ، نەوسوەیل‌و بەهاروگـــوڵ‌و باخ‌رازاندنەوە ، زیارەتی شەخس‌و مەشایەخ ، راووشکار .

## مەلا مصطفای بێسارانی[1]

ئیمشەو ئاهیرێ گڕ بەست نە دەروون
بڵێسەش یاوا وە سەقف گەردوون

---

(1) شایانی باســـە ئــەم پــارچــە شــیعرە دووجار لــە لایەن مامۆستا عوثمان‌هەورامی‌یەوە لە ژمارە(١٤٢)ی (بەیان) و (٣٦)ی (رەنگین)دا بێ جیاوازی‌و دەستکاری لە وەلامی پرسیارێکی پیرەمێرددا بڵاوکراوەتەوە.

جه کۆکۆی ئاهیر ، جه بلێسەی نار
ستێزام چون بەرق هەر کەردم هاوار
جه هاوار هاوار شفاو لالەی من
جه هەی‌ئاو ! هەی‌ئاو ! شین‌و زالەی من
تمەز مشنەۆ یەك خوداتەرسێ
موسولمان صیفەت ، راگەی حەق پەرسێ
ماوەرۆ گۆزەی نەفت (بیت‌المال)
مشانۆ وە رووی گڕبەستەی شەماڵ
پێسە مزانۆ یە گۆزەی ئاوەن
تمەز گۆزەی نەفت کۆی تەوەن‌تاوەن
گۆزەی نەفتش کەرد وە بلێسەم‌دا
قرچەی گۆزەی نەفت یەند ستێزەم‌دا
هەرتا کە سەحەر هەر سۆزام بە سۆز
سەحەر سفتەی کۆم با بەردش چون تۆز
هەرکەس وێنەی من ئیقبالش چەفتەن
مواچۆ : هەی‌ئاو ! نەصیبش نەفتەن !

## رەنجـووری

ئیمشەو جه نەحسی‌و سیایی چارەم
گوشاد بی پەردەی قاپیی پەژارەم
هەر یەند خەیالان دەروونم تاودا
ناغافڵ خێزا گڕەم جه ناودا
جه گڕەی ئایر بەرز بلێزە
دەرلاد هەوام سەند وە صەد ستێزە
جه بەرزیی بلێس گڕبەستەی تاوم
جه هەی‌داد ، هەی‌داد ! هەی‌ئاو ، هەی‌ئاوم

تمەز ئاوایی جە سەر تا پایین
گشت مبان بێدار جە خاو شیرین
میان موینان کوورەیێ وە تاو
دەو مدەن وە دەو پەی ئاوردەی ئاو
وەر جە گشت کەسان نەزان حالەیێ
دنیا نەدیدەی چواردەسالەیێ
جەلدو چاپوکخێز بەرمیۆ نە خاو
چون طەیر تیژباڵ دەو مدۆ پەی ئاو
میۆ موینۆ ها گۆزێ کەوتەن
مواچۆ ئاوەن ، تمەز ئەو نەفتەن !
وە دەس ئیشارەت وە زوان لاڵام :
هەی نەفتەن هەی‌نەفت ! مەشنە وە باڵام !
جە نەحسیی طاڵەم هەرچەند واتم نەفت
ئەو ئاما وە لام ، صەدای من نەشنەفت
دەس بەرد وە باڵا گۆزەی نەفتش شەند
بڵێسەی بەرزم ئەوج هەوا سـەند
شەو بی وە شوعلەی چراخان نوور
من گرم تاو بەست چون تاو تەنوور
تا سەحەر سۆزام من بەی نەفتەوە
بڵێسەم گر بەست هەی نەسرەفتەوە
سەحەر سفتەی مۆم چون چلۆسك دار
بی وە زووخاڵین وامەندەی هەوار
(رەنجووری ا)·هەرکەس دڵدا وە خەیاڵ
ئاخر سەرتاپاش مبۆ وە زووخاڵ[1]

---

(۱) بروانە : محەمەدعەلی قەرەداغی ، دیوانی رەنجووری ، چاپخـانـــەی ( آفاق عربية ) سـالی : ۱۹۸۳ ل : ۸۳ .

## معدومی در ردیف فرموده[1]

ئیمشەو ئاهیرێ گڕ بەست نە دەروون
بڵێسەش یاوا بە سەقف گەردوون
جە گڕەی ئاهیر ، جە بڵێسەی نار
سۆزیام بە سۆز هەر کەردم هاوار
جە کلپەی ئاهیر جە بڵێسەی تـاوم
جە هاوار ، هاوار ، هەی ئاو ! ئاوم !
تمەز ئاوایی جە سەر تا پـایین
گشت مبان بێدار جە خاو شیرین
زووتر جە گشت کەس یەک نەزانحاڵێ
دنیانەدیدەی چواردەســاڵێ
بە چوستو چاپوك هۆڕێزا بە تاو
هەڵمەت مبەردش پەی ئاوردەی ئـاو
مدیۆ موینۆ گۆزەیێ کەفتەن
مواچۆ ئاوەن ، تمەز یـە نەفتەن
ماوەرۆ گۆزەی نەفت ( بیت المال )
شانۆش بـە ئاهیر گڕبەستەی شەماڵ
هەر جە دوور ئاما من بۆش شنەفتم
زانام مەرگ من ، وە کۆس‌دا کەفتم
بـە دەست ئیشارەت بە زوبان لاڵام :
هەی نەفتەن !هەی‌نەفت ! مەشان وە باڵام
جە بەدبەختیی من ، هەم ستارەی چەفت
گۆش نەبی وە دەنگ ، صەدای من نەشنەفت

1) واتە (مەولەوی)ش لەسەر شێوەی ئەو فەرموویەتی .

دەست بەرد وە هەوا[1] گۆزەی نەفتش شەند
بەتەر بڵێسەم دوودو ئاهیر سەند
گۆزەی نەفتش شەند وە بڵێسەمدا
بە قرچەی ئاهیر خاص ستێزەمدا
ئەو شەو سۆزیام من بەو نەفتەوە
بەرزیی بڵێسەم هەر نەسرەفتەوە
ئەو شەو تا سەحەر سۆزیام بە سۆز
سەحەر سفتەی سۆم با بەردش چون تۆز
هەرکەس وێنەی من ئیقباڵش چەفتەن
نەواچۆ هەی ئاو ، نەصیبش نەفتەن[2]

## باباشێخی بێیارانی[3]

ئیمەو ئاهیرێ گرِبەست نە دەروون
بڵێسەش یاوا بە سەقف گەردوون
جە کرپەی ئاهیر ، جە بڵێسەی تاوم
جە هاوار هاوار ، هەی ئاو ! هەی ئاوم !
جە کرپەی ئاهیر جە بڵێسەی نـار
هەر سۆزام بە سۆز هەر کردم هاوار
جە هاوار هاوار ، شفاو لاڵەی من
جە هەی ئاو هەی ئاو ، شینو زاڵەی من
تەمز مشنەوۆ یەك خوداتەرسێ

---

(١) لێرەدا ( وەو = وەهەو ) بوو من ( ١ ) یەکەم بۆ زیاد کرد .
(٢) ئەم پارچە لە لاپەرە (٢٩٤)ی کەشکۆڵەکەی ( قادری سـەڵەسـیی ) وەرگیراوە .
(٣) لە لاپەرە (١١٢)ی کەشکۆڵی ( قادری سەڵەسیی ) وەرگیراوە .

موسوڵمان صیفەت ڕاگەی حەق پەرسێ
ماوەرۆ گۆزەی نەفت ( بیت المال )
مشانۆ وە رووی گڕبەستەی شەماڵ
گۆزەی نەفتش کەرد وە بڵێسەمدا
قرچەی گۆزەی نەفت هەر ستێزەمدا
هەرکەس وێنەی من ئیقباڵش چەفتەن
من واچووم هەی ئاو نەصیبش نەفتەن
من کۆی نەفتینم [ تو ئاهر بەست ! ]
[ ... ڕانـــام کەرد بەست !]
گڕ بڵێسەش بەست هانام کەرد بە شار
دیم کە پەیدا بی هەزارێ گیاندار
هەر یەك جە لایێ ئاو وەنەم شانا
هەر چەند ئاما گڕ پرشنگ مشانا
ناگاه پەیدا بی قیبلەی من جە دوور
مدا وە سەردا موات : هەی کۆی طوور
چون ئاهووی خوتەن ئاما جە لاوە
دەست دا وە ئاودا سفتەم کوشتاوە

## نموونەیەکی دیکە

ئەمەیش نموونەیەکی دیکەی کێبەرکێ لە نێوان (خانا)و(مەحرووم)و یەك دوو شاعیری دیکەدا کە کاتی خۆی لە (هاوکاری)[1]دا بلاوم‌کردەوە ، ئێستەیش بۆ ئەوەی لەم جێگەدا ڕووناکییەکی باشتر بە مەبەستەکە بـدات دەیخەمەوە ڕوو :

---

(١) بڕوانە : جارێکی دیکە مەحرووم بەربەرەکانی خانا دەکا ، محەمەدمەلی تەرەداغی ، هاوکاری ژمارە ٤٥١ ، ٩٧٨/١٢/٤ .

( خانا ) دەلێ :

خەدەنگ غەمزەی وەنەوشە خالان
حەربەی نیم نیگای نازك نەوهالان
ئەر بگنۆ وە سەنگ کۆی سەخت خارا
مکەرۆش وە گەرد وە بێ مودارا

( مەحرووم )یش بەم شێوە لەم مانادا خۆی نواندوە :

مەخمووری دیدەی قطرانی خالان
نیم نیگای موژەی گەردەن غەزالان
ئەر بگنۆ وە هەرد قوللەی کۆی ( پڕاو )
وە ذات موطڵەق مکەرۆش بە ئاو

هەر لەو دەسخەتەدا کە ئەم شیعرانەم لێ وەرگرت نموونەی دوو چوارخشتەکیی دیکەیش هەیە هەر لەم بابەتەنو بوونیان لێرەدا بێ سوود نی یە :

چوارخشتەکیی یەکەم :

زڕەی زریزەی بازوو خڕخالان
پەشێوی شێوەی پەشێودەسالان
ئەر بگنۆ وە نەجد قوللەی پڕ خەطەر
مکەرۆش وە تۆز باد بوردەی سەحەر

چوارخشتەکیی دووەم :

زەڕە جە زووخاو دەرد دەروونم
تاف سەیل هەرس دیدەی پڕ هوونم
ئەر بگنۆ وە کاو قوللەی (شاهۆکۆ)
وە ذات بێچوون تاوتۆش جە تۆ

ئەوەی دەبێ لێرەدا بگوترێ ئەوەیە کە ئەم دوو نموونە ناوی کەسیان بە سەرەوە نی یەو ، تەنها (ولە)یەکیان لەسەر نووسراوە ، کە وا دەگەیەنێ

ەر هی ئەو شاعیرانە بن ، بەڵام ئەمە دروست نی‌یە ، چونکە هەر لە ناو
ەمانەدا ئەو دوو بەیتەی (خانا)یش نووسراوە کە لێرە بە دواوە لەگەڵ
ەرەبەرەکانی‌یەکەی (مەحرووم)و هەڵسەنگاندنەکەی (مەولەوی) لەسەر
ەردوکیان ، وەك نموونەیەکی دیکە ، بڵاویان‌دەکەینەوە .

شیعرەکانی خانا :

بەرق سەیف ناز ئەبرۆخەمینان
عەکس ماوی‌خاڵ خورشیدجەمینان
ئەر بگنۆ وە کۆی قوللەی قەزاڵە
مەکەرۆش وە بووڵ سفتەی سەدساڵە

(مەحرووم)یش ئاوا بەربەرەکانی شیعرەکانی (خانا)ی کردوەو
ناردوویەتی بۆ (مەولەوی) تا رای خۆی دەربڕێ‌و بزانێ کامیان
سەرکەوتووترن :

بەرق بەرقەی ناز عیشوەفرۆشان
چەخماخەی لەنجەی تەڵانەگۆشان
بزیسکەی نیگای دیدە شابازان
بریقەی غەمزەی شەکەرین رازان
ئەر بگنۆ وە سەنگ جای تەجەللای نوور
مەکەرۆش وە گەرد چون سورمەی کۆی توور
(مەعدووم!) راس(خانا) سۆزان عەشق بی
کەی وێنەی (مەحرووم) هەر عەشقش مەشق بی ؟

(مەولەوی)یش ، کە لەسەر داوای (مەحرووم) هەڵسەنگاندنی
هەردوو دەقەکەی خراوەتە ئەستۆ ، بەم جۆرە رای خۆی دەربارەیان
دەربڕیوە :

نەوباوەی خەیاڵ (مەحرووم) دانا
رەدیف لەطیف ظەریف (خانا)

یاوا ، وە دیدەی کەم بینام ساوا
جە نەو بینایی پەی دیدەم یاوا
پەیڕەوی (خانا)ت یاد ئاوەردە بێ
ئەو ئەسڵو وێت فەرع حەساو کەردە بێ
لاکین زادەی طەبع بۆ عەنبەرینت
دەسڕێسەکەی فیکر بیکر شیرینت
پەسەندیدەی فام عەقڵ دانا بێ
خاستەر جە خەیاڵ خاصەی (خانا)بێ
زیادە پەی فەرع وە سەر ئەسڵەدا
خاصەی واتەی تۆن جەی سەرفەصڵەدا

## نموونەیەکی دیکە :

ئەمەیش نموونەیەکی دیکەیە لە نێوان مەولەویو مەلا (قاسم)ناوێکدا کە کاتی خۆی بڵاوکردووەتەوە[1] ، وا لێرەدا بۆ زیاترتیشکخستنە سەر مەسەلەکەو ، بۆ ئەوەی باشو ئاسانتر دەست خوێنەر بکەوێ جارێکی دیکە تۆماری دەکەمەوە :

**مەولەوی دەڵێت :**

تەرسوون ئەر بەدەن رەقیب‌دڵ‌سەرد
کەردش وە تووتیا ئاسیای چەپ‌گەرد
وەخت تەماشای ئەو بەرگوزیدەم
شەماڵ بشانۆ گەردش نە دیدەم

**مەلا (قاسم)یش ئاوا بەربەرەکانی (مەولەوی) کردوە :**

تەرسوون ئەر ئازیز جە پرمەیلی‌ی وێش
کیانۆ نامەێ ئەرلای خەستەی وێش

---

(١) بروانە : هاوکاری ، ژمارە ( ٤٣٦ ) ١٩٧٨/٨/٧ .

جەو دەمدا رەقیب جە حەسرەت بۆ گەرد
شەماڵ پەیاپەی بەرۆش نە رووی هەرد
وەقت تەماشای نامەی ئازیزم
شەماڵ بشانۆش دیدەی هوونڕیزم

**لاســـایی‌کردنــەوەیەکی دیکــەیش :**

له کەشکۆلی ( سەلەسی )دا پارچەیەك شیعرم بە ناوی (مەلا عەزیزی نەغەدەیی)یەوە دۆزیەوە ، بە پێی ئاگاداری من بڵاونەکراوەتەوە، نووسیمەوەو پاكنوسم کرد ، دوایی پارچەیەك شیعری هەمان شێوەو ڕێبازم لـە ژێـر ناوی ( سەید محەمەدی خانەقا)دا دۆزیەوە ، ئەویشم نووسیەوە ، بەڵام دوایی کە ورد گەڕام دەبینم بە بێ ناوی کەس لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)[1]دا بڵاوم کردوەتەوە . لە بەر ئەوەی ئەم دوو نموونەی لاسایی‌کردنەوەیش یەك بخەمو ، لێرەیشدا ناوی شاعیرەکەی بـە سەرەوەیە ، جارێکی دیکـە بڵاوی دەکەمەوەو ، لە خواریشەوە سووکە بەراوردێکی هەردوو نوسخەکە دەکەمو ، بۆ نوسخەکەی ( ڕۆشنبیری‌نوێ)پیتی (ع) دادەنێم .

دەبێ ئـەوەیش نەبـوێـرم کـــە ئـەم پارچەی ( سەیدی خانەقا ) دوو جار لـە کەشکۆلی ( سەلەسی )دا نووسراوە ، جارێك بـە نـــاوی سەید محەمەدی خانەقاوەو ، جاری دوایی بێ ناوی کەس ، بـەڵام جـارە دواییەکە ـ لەگەڵ کەمێك جیاوازیدا ـ وەك دەقی چاپەکە وایە .

## سەید محەممەدی خانەقا

چـراخـم دینـت
نەقشەن نەرووی دڵ ئارەزووی دینت
بەرقەی[2] کارخانەی ئوستاد جەمینت
سیاتەر جە دووی قەیس دەردینت

(1) بروانە : ڕۆشنبیری‌نوێ ، ژمارە (٧٥) تەمووزی (١٩٧٩) .
(2) بەرقەی(ع)بریقە

لادەر جە صەفحەی بەیضای جەمینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

نازك ورشەی خۆی گۆنای گوڵڕەنگت
نازك لارو لەنج غەمزەو نازەکەت
نازك ورشەی خۆی گۆنای گوڵڕەنگت
نازك پرشەی چەرخ دیدەی سێوەنگت
نازك ئەگریجەی پای عەرەقچینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت[٣]

★ ★ ★

تیر نیم‌نیگای گۆشەی چاوەکەت
گوزەر کەرد نە جەرگ[٤] دڵ‌کەواوەکەت
ئەلحەق بینا ویم[٥]نەونەمام نـۆ
ئارۆ نیم‌نیگای دیدەی مەست تۆ
ئیحیا کەردەوە خەستەی خەمینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

وەختێ بەو مەخصەل[٦] گۆنای لالـەوە
بەو تەرتیب تیپ زەنگیی خالـەوە
مەخرامیاوە پاینەی[٧] وە نـەرم

---

(٣) لیر(ع)ئـەرك .
(٤) گوزەرکەرد نە جەرگ ( ع )سەندە بی حەیات .
(٥) بینا ویم (ع) بینایم
(٦) بەو مەخصەل (ع)وەو مەحفەل .
(٧) پاینەی (ع)پـا منیا .

پەیاپەی مەوات وە بانگ بێ شەرم :
صۆفیو مەلاو شێخ شەیدان پەی دینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

باقی نازاران صوراحیی گەردەن
هەرکەس کەسێوەش بەردەن وە مەردەن[8]
بەڵام ئەی شێوە ، ئەی شیشەگەردەن
هەزارکەس چون من بەردەن وە مەردەن
سا چون وەی طەورەن [ طرزوانیت ! ]
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

گوڵ خجڵ نە رووی نازكطەرز تۆن
عەرعەر حەلقەگۆش باڵای بەرز تۆن
ئاهوو شەرمەندەی دیدەی باز[9]تۆن
عالەم[10] ئاوارەی غەمزەو ناز تۆن
پێچ دا وە ماران زولف چینچینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

باز [ بیانباز ! ] [11] باڵای شەنگ تۆن
مەزەی رێزەی راز غونچەی [12]تەنگ تۆن

---

(8) هەرکەس...تاد (ع)هەرکەسێ کەسێش سەودایی کەردەن .
(9) باز (ع) مەست .
(10) عالەم...(ع)چون من دڵداران دڵ پابەست تۆن
(11) باز[بیانباز](ع)ناز بێ ئەنداز
(12) تەنگ ئەم وشە لە لای من کەوتبوو لە (ع)مان وەرگرت .

نازکیی لالەی گۆنای ئەحمەریی
ئینس‌و جین‌و وەحش[13] فریشتەو پەریی
کەردەن وەهامراز[14] قەیس دەردینت[15]
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

ئازیزم تانەی گرۆی بێ دەردان
ئاهیرێ نە تۆی دەروونم بەردان
بنمانە جەبین[16]بەدر جەبهەی وێت
من ئاسا بەلکم شەیدابان پەرێت
بەڵام پەشێوەن زولف موشکینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

یەك رۆ جە ناکاو جـە صوب سەحەردا
پەنجەرەی ئەیوان مەشریقیی هۆردا
هەوادا پەردەی رووی صەفحەی جەمین
خێزا واوەیلای گرۆی موذنیبین
ماشەڵلا جە شەوق بەیضای جەمینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

## ملا عزیز نغدی

قیلەم بۆی شنۆی زولف چین‌چینت
ئەگریجەو پەرچەم بۆی عەنبەرینت

---

(١٣) وەحش(ع) طەیر .
(١٤) هامراز (ع) هامدەرد .
(١٥) دەردینت (ع)خەمگینت .
(١٦) جەبین (ع) پێشان ، ئەم نیوەبەیتەو نیوە بەیتی پێشوو لە لای (ع) باشوو پێشـــــن .

شۆڵەی شەرارەی شەمس جەمینت
لەرەی شەمامەی سینەی سیمینت
بەردەن وە مەردەن بەندەی خەمینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

تاسەی تای گیسووی نازك خێزەکەت
ئارەزووی دیدەی خەدەنگ ڕێزەکەت
بۆی کاڵای باڵای عەرعەرپێزەکەت
سەر گۆنای گوڵگوون عەطرامێزەکەت
گرۆەستەن یانەی موبتەلای دینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

سەر طەرزو سەر سەرو سەر باغچەی باغان
دەرمان زامان دمروون پڕداخان
سەرکردەی فیرقەی نازك ئەندازان
سەردەلیلەی رەم دیدە شەهبازان
سۆچنات سۆچیای شەمس جەمینت
فەلەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

ئازیزم گەردەن صوراحیی بێ گەرد
چەنی نەناڵیی چەنی ئێش سەرد !
وەصلت پەی خەڵکی ، هیجرانت پەی من
دەرمانت پەی ئەو ، زامانت پەی من

مەیلت چەنی ئەو ، چەنی من قینت
فەڵەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

من دلم وە هوون ڕەنگ کەردەن یا ئەو ؟
من وێم وە سەرگەرد تۆ کەردەن یا ئەو ؟
من پێکیای پەیکان نیم‌نیگات یا ئەو ؟
من چەمم کەشتەن خاك وە پات یا ئەو ؟
خەندەت چەنی ئەو ، چەنی من کینت
فەڵەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

دەك ڕەحمەتت بو پێساران مەنزڵ
خاصش فەرماوان ئوستاد کامڵ :
ئەگەر مەزانام وەفات نمەبۆ
دڵ مەدام وە سیخ نمەدام بە تۆ
ڕەحمێ کەر وە حاڵ دیدەنمینت
فەڵەك نەشێوتۆ شێوەی شیرینت

★ ★ ★

# صادق ـ سەیید محەمەد صادقی صەفاخانە ـ

لـه بەرگی سێیەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی‌دا[1] پارچەیەك شیعری (صادق)م بلاوکردەوە ، بەلام ئەو کاتە هیچم لە سـەر ژیانی نەنووسـی ، کە ئەم دەست خەتەیشم ـ ٨٢٨١ ـ ئەمسەرەوسەر کرد بینیم پارچەیەکی دیکە شیعری (صادق)ی تێدایە ، بۆ ژیانی سەرێکم لـە کتێبەکەی مامۆستا ( بابا مەردۆخ )دا ، لەوێ بینیم ژیانێکی تا ئەندازێـك درێژو خۆش‌و پارچەیەك شیعری ئەم شاعیرەی تێدایە ، دوای وردبوونەوە دەرکەوت هەر هەمان پارچەیە کە لە دەست‌خەتەکەی لای مندایە • بە باشم زانی لێرەدا پوختەیەك لەو ژینامەو ، پارچە شیعرەکە لـەگـەڵ بەراوردی جیاوازی‌یە سەرەکی‌یەکانی‌دا بنووسم :

سەیید محەمەد صادق لە سەیدەکانی صەفاخانە بوەو ، شاعیرێـکی هەستیارو شۆرەنگێز بوە ، لـە دەوروبەری سـالی (١٢١٢ی‌ك ١٧٩٧ز)دا لەدایك بوەو لە سالی (١٢٨٠ی‌ك ١٨٦٣ز)دا کۆچی دوایی کردوە •

ئەم پیاوە دوای تەواوکردنی خوێنـدن لە مەدرەسەی بـاو باپیری خۆی‌دا دەرسی گوتوەتەوەو ، پیاوێکی بەرێزو ، دەسـت‌و دڵ گوشـادو میوان دۆست بوە • پێش ئەوەی ماڵ پێکەوە بنێ دلی لە کچێك چـوە کـە ناوی (جیهان‌ئارا) بوە ، کەس‌و کاری مامۆستا کچەکەیان بۆ داواکردوەو ، بە جوانترین شێوەی ئەو سەردەمە دیاری‌کراوەو ، بۆی مارەکراوە ، بەلام پێش بەیەك‌گەیشتنیان چنگی مەرگ دەزگیرانی مامۆستامانی گـرتوەو ، گوڵ‌خونچەی‌ئاواتی ژیانی هەڵپرووکاندوەو ، ئەو داخە سەختەی ناوە بـە جگەری مامۆستادا • سەییدی داماو دوای ئەم کارەساتە شێت‌و سەرگەردان

(١) بڕوانە : مشاهیر کرد ، ١/١٨ ٤ • هەروەها بڕوانە ل : (٥٣٧)ی‌بنەماڵەی زانیاران •

بوەو ، ماوەیەك داوی‌یەتی‌یە کێوان ، تا دوایی کەس‌و کاری بڕیاریان داوە کە بیبەن بۆ خزمەت شێخی سیراجەدین لە طەوێڵە ، بەڵکو بە دوعای ئەو خودا شیفای بدات ، ئاگایان لەوە نەبوە کە سەرنوێشت لەگەڵ ئەودا لە کینەدایەو ، داوێکی نوێی بۆ ناوەتەوە ! لە رێگەی چوون بۆ خزمەت شێخدا چاوی بە کچێکی ( صوراحی )ناودا هەڵدەتەقێ کە زۆر لە جیهان‌ئارای جوانەمەرگی دەزگیرانی دەچێت‌و جارێکی دیکە تیری ئەوین دلی دەپێکێتەوە !

هەرچۆن بێت دەیگەنە خزمەت شێخ • شێخ کە رووداوی ژیانی سەیید ئەزانێ‌و ، لە بەسەرهاتەکەی ئاگادار دەبێت ، دەنێرێ بۆ لای باوکی صوراحی‌و بۆی داوا دەکات‌و ، تفاقی خوازبێنی‌و گواستنەوەی بۆ ساز دەکات‌و ، کار دێتە سەر گواستنەوەو بە ئاوات‌گەیشتنی مامۆستا ، بەڵام بۆ بەختی رەشی ئەو ، جارێکی دیکەیش رۆزگار یارمەتی نادات‌و مەرگ چنگ لە رەگی گولخونچەی ئاواتی توند دەکات‌و ، جارێکی دیکە جەرگی مامۆستامان دەداتەوە بە تەنوورەوەو ، مامۆستا لە جاری پێشوو زیاتر شەیداو سەرگەردان‌و ئاوارە دەبێت‌و دەداتەوە کێوو ، لەم رۆژانەی ژیانی‌دا شیعری بە سۆزی دلداری وتوەو ، جاری وا هەبوە ناوی هەردوو دلدارو دەزگیرانەکەی لە شیعرەکانی‌دا بردوە وەك :

ئەعضای شکستەی پڕ جەراحە خۆم
بێ (جەهان‌ئارا)و بێ (صوراحە) خۆم

بەڵام هیمەت‌و دوعای شێخ مامۆستای بە ئاوات‌نەگەیشتووی گێڕاوەتەوە بۆ خانەقاو ، ئەو ئەوینە (مەجازی)یەی بوە بە ئەوینی (حەقیقی) •

صادق پیاوێکی شۆخ‌و ئەندام‌ڕێك‌و جوان بوە ، زۆریش دەنگی خۆش بوە ، دەگێڕنەوە لەو رۆژانی شەیدایی‌و سەرگەردانی‌یەدا هەر کاتێ

بەو دەنگە خۆشەی شیعری خوێندبێتەوە پەلەوەرو جانەوەرانی کێو لـــە دەوری خڕبوونەتەوەو گوێیان لە شیعرە پڕ سۆزەکانی گرتوە !

صادق هاوچەرخی ( سەیید محەمەدسەعیدی کوچکچەرموو ) بومو، نامەو شیعریان بۆ یەك نووسیوەو ، جار جاریش بە دەشتودەرکردنو راوو شکارەوە لە کێوەکانی (کوچکچەرموو)و (باینجۆ)دا رایانبواردوە[1]

– ١ –

وەرنەود طەی کەن راگەی جەنگەڵان
جە شۆن شاباز لان جە ئەردەڵان
بەڵ جە لوطف حەق جە ئەنفاس پیر
وە حەلقەی تۆڕدام باوەرین وە گیر
راویش بکەرین چون میرشکاران
سارێش بۆ جای تیر تانەی ئەغیاران
(یاغوث‌الاعظم)سەردار (گێلان)
جەلای ژەنگ دڵ مینای دڵ لێلان
دەخیل ئەر مەندەن هیممەت جە لاتان
هانام ئاوەردەن وە خاکپاتان
ئەرصەد عاصی‌یەم هەر ئێدم زانان
نامم وە ئەولاد ئەحمەد موانان
نامەی ئەعمالم ماوەرۆ وە زەین
بم‌بەخشە وە نوور شای ( قاب‌قوسین )
هیمەتێ کەرۆی جە عام دیار بـۆ
چون بەرق دەیجوور سایەی بەهار بـۆ
( یا غوث الاعظم ) یا کۆسەی هەجیج
شابازم بەندەن نـە زایەڵەی زیـج

هیمەتێ کەروون بێ صاحیب مانۆ
یا ( صادق ) وە سەیر باڵای ئەو شانۆ
هەر وەقت بیۆ دەنگ لالەکەش
[ هونە بدرو پیریو بالکش ! ]
[ کوشتاو پیش بدین بو نباتوە ! ]
بار ئەو لانەکەی ویش نەباتەوە
یا صاحیب ئەلطاف کان موشکیلات
با ( صادق ) جە دەست غەم بیۆش نەجات[1]

- ٤ -

خەم ! کۆتاییت بۆ[1] !
ئەی خەم ساوەسەن با کۆتاییت بۆ !
مەینەت[2]! بۆ وە سەر با دیاییت[3] بۆ
خەفەت ! بەس بیساط بەزمئارایت بۆ
هیجران[4] شەوگارت نەدارۆ پایان ؟
فیراق ! صوبح تۆ کەی بۆ نمایان ؟
خەیاڵ ! خامۆش بە هەر سات جە لایێ
وەسواسە ! وەس کەر هەر سات سەودایێ
هەناسە !سەردبای وەس کەرە دوودیێ

---

(١) ئەم پارچەیش لە کەشکۆلێ ( سەلەسیی ) وەرگیراوە .

(١) ئەم پارچە ئەوەیە کە لە مەشاهیرەکەی مامۆستا (بابا)یشدا هەیەو ـوەك گوتمانـ لێرەدا جیاوازیە سەرەکیەکانی دەنووسین ، ئەوەی کە لە سەرەوە نووسراوە دەقی کەشکۆلەکەی (سەلەسی)یەو ئەوەیش بە پیتی( با ) جیاکراوەتەوە جیاوازیەکانی بابایە :

(٢) مەینەت(با)خەفەت .

(٣) دیاییت(با)دماییت .

(٤) خەفەت(با)مەینەت .

دەروون[٥]! وەس کێشە ناڵەی بێسوودیی
تاقەت ! ئەی تاقبای بگیرە تاقەت
سا دەخیل ئەی مەیل[٦] بازم فیراقەت
کام زام بی جە تۆ من نەویم نەصیب
جەفا پەرێ من ، وەفا پەی رەقیب[٧]
ئەی دڵ وەس گێلە ها پڕ[٨] بیت جە هوون
وەس گڕە چون گڕ شەماڵەی[٩] سەبوون
ئەی چەم بینات شی وەس کەر بەنگیزە[١٠]
ئەسرین پێت نەما [١١]سا وەس بڕێزە
شادیی وە کۆ شی هیچ نەداریی شۆن
ئاخ دەماغ جە کۆی ؟ یە بێ تۆیی[١٢] تۆن !
بنمانە گۆشە لەم[١٣] گۆشەی کڵاو
ئەی [ سپاجدور بکرە !] بڵاو[١٤]
( صادق ! ) دەماغت لێم [١٥] بێ دەماغەن
کەیفت بێکەیفەن شادیت ناساغەن[١٦]

---

(٥) دەروون(با)ناڵە .
(٦) مەیل(با)لەیل .
(٧) ئەم بەیتە لە(با)دا نیە .
(٨) ئەی. . .(با)ئەی دڵ وس کولیە با پربیت .
(٩) شەماڵەی(با)شەرارەی .
(١٠) بەنگیزە(با)ئەنگیزە .
(١١) پێت نەما (با)بیت وە هوون .
(١٢) بێ‌تۆیی(با)نەبیەنی
(١٣) گۆشەلەم(با)جارێ سەر .
(١٤) ئەی. . .(با)ئەی سیا جە دەور من کەری وڵاو
(١٥) لێم (با) لێت .
(١٦) ناساغەن (با) ناچاغەن .

## خانای قوبادی

له بەرگەکانی دیکەی ئەم کەشکۆلەو چەند وتاریشدا شیعری ئەم شاعیرەم بلاوکردوەتەوەو ، وا ئەم جارەیش ئەم شیعرانەم دەست کەوت لێرەدا پێشکەشیان دەکەم ، بە هیوای ئەوەی وردەوردە بتوانین دیوانێکی خنجیلەی ئەم شاعیرە گەورەی خاوەنی ( شیرین‌و خوسرەو ) پێك بێنین .
دەربارەی ژیانیشی لەوە زیاترمان دەست‌نەکەوتوە کە پێشتر باس‌کراوە .
سەرچاوەی ئەم شیعرانەیش کەشکۆلە رەنگینەکەی ( ئەحمەدی‌براله )یە .

**- ۱ -**

عـزیز الغفـار ... ...
یا عظیم العفو عزیز الغفـار
ویا نفخ صور في یوم القرار
واحشرنا مع النبـي المختـار
في یوم کالمهل طعام الأثیم
یغلي في البطون کغلي الحمیم
شادم جە واتەی بینای بێ نەظیر
بمغفرة وأجـر کبـیر
ماوەرەم نە سیلك زومرەی موشریکون
وضل عنهم ما کانوا یدعون
ولا تکتبني کمن - یا رحیم -
یحل علیه عذاب مقیم
عەفوم کەر بە لوطف جە کردەی گوناه
یوم لا مرد له من الله
یاعمیم اللطف کثیر الاحسان
اعوذ بك من شر الشیطان

به وەفق بورهان سەعادەت عەمیم
ويل لكل أفاك أثيم
جە (ناروێل) بدەرم نەجات
ارزقني بالفضل من الطيبات
ولا تنسني انت يا غفار (!)
في الحشر كما ينس الكفار
ئەو ڕۆ نە جەنەت زومرەی موئمینین
يتساءلون عن المجرمين
قالوا لم نك من المصلين
وكنا نخوض مع الخائضين
ادفع الهی کل بلائي
اغفرك (!) بالعفو كل خطائي
جەو دەمدا (وظن انه الفراق)
والتفت الساق (جەهەیبەت) بالساق
بە کەریمیی وێت کیبریای ئەقدەس
چونکە فەقیرم بە فریادم ڕەس
جە ڕووی مەرحەمەت دلسۆزیی بکەر
ماسلککم ماچان فی سقر
ياكثير اللطف شديد العقاب
جودك بحكم بلا ارتياب (!)
ڕۆی : ياليتني كنت ترابا
لا يملكون منه خطابا
يا مالك الملك يوم التنادي
ببەخشی تەقصیر(خانای قوبادی)

جەو پەی عەفوتەن پەی عاصی عەمیم
انك انت التواب الرحيم

- ٢ -

ياأولي الالباب ... ...
نقسمو (!) بالله يا اولي الالباب
من ملة الكذب في يوم الحساب
لا يخفف عنهم العذاب
يا أيها الناس نحو المشركين
ولا تكونن من الممترين
فاستعذ بالله سميع بصير
من عذاب النار وبئس المصير
ايها الاخوان لكون النجاة
اقيموا الصلاة وآتوا الزكاة
واتقوا من بطش رب العالمين
وان الله مع المتقين
واتقوا الله يا أهل الانسان
لا تتبعوا خطوات الشيطان
ومن يتبع خطوات الشيطان
إنما هو من أهل الخذلان
ومن يحترز من الخطايا (!)
احسن قولا وفي الدعايا
يؤتيه الفردوس ربك اليقين
وكذلك نجزي المحسنين
لا تخف (خانا) من شر الجحيم
وان الله غفور رحيم

# میرزا شەفیعەکان

لە رۆژنامەی هاوکاری[1]دا باسی ئەوەم کرد کە تا ئێستە بیۆگرافیا ، یان فەرهەنگی نازناوی شاعیرانیکورد نەنووسراوەو ، ئەوەی بە دوای ناوو مێژووی ژیانی شاعیرانماندا بگەڕێ تووشی چەندین گرفتو گرێکوێلە دەبێت ، لەوانە : شاعیری وامان هەیە لە ژیانی شیعریدا زیاتر لە یەك نازناوی بەکار هێناوە ، وەك جاری وایش هەیە زیاد شاعیرێك یەك نازناویان بەکار هێناوە ؛ دیارە ئەم کارە دووسەرە لە مەیدانی ئەدەبی کوردیدا ، کە یەك شاعیریشمان نییە دیوانی دەستخەتی خۆیی بۆ بەجێهێشتبێنو دەست ئێمە کەوتبێ ، ئەگەر نەڵێم یەك شاعیرمان لە شاعیرەکۆنەکان نییە کە دیوانی دەستخەتی - با بە خەتی خۆیشی نەبێ - بە تەواوی دەست ئێمە کەوتبێ ! جا لە بارو دۆخی ئاواداو لە کاتێکدا ئەگەر پەردەیەك لە بەرهەمی ئەو شاعیرانە مابن لەملاو لەولاو ،لەم کەشکۆڵو ئەو بەیاضدا بە خەتی ئەم کۆڵکەمەلاو ، ئەو نیمچەخوێندەوار نووسرابێتەوەو زۆر جاریش هەر بیریان لەوە نەکردبێتەوە کە تەنانەت ناوی خودی شاعیرەکە بنووسن ، نەك لە شاعیرانی دیکەی جیابکەنەوەو ، ناوو شۆرەتی تەواوەکەیان بنووسن .. لە بارو دۆخی ئاوادا ئەبێ چۆن بگەینە ئەنجامی جیاکردنەوەی ناوی چەند شاعیرێك کە یەك نازناویان بەکار هێنابێ ؟

ئەمەی کە لە بەردەستماندایە نموونەیەکی ئەم گرێکوێرەیە . زۆر جار لە کەشکۆڵەکاندا ناوی ( شەفیع ) یا ( میرزا شەفیع ) دەبینینو، منیش تا ئێستە چەند پارچە شیعرم بەم ناوەوە بڵاوکردوەتەوە ، ئەم جارەیش چەند پارچە شیعری دیکەم دەستکەوت ، ویستم لەم هەلەدا بە گوێرەی دەستکەوتن شتێك لەسەر ئەم شاعیرە ، یان راستتر بڵێین لەسەر خاوەنی

(1) بڕوانە : هاوکاری ژمارە (٤٩٦)ی ١٩٧٩/١٠/١٥ ، ببلیۆگرافیای شیعری کوردی هەنگاوێکی پیرۆزی ئەدەبی کوردییە .

